پەیمانگای باسک بۆ پەروەردە و پێگەیاندن





پێشبرکێی ژیانی

# شەفیعی ئوممەت ﷺ

# 100

پرسیار و وەڵام

گوڵاوی سەرمۆر

ژیننامەی پێغەمبەری مەزن

نووسینی: صفی الرحمن المبارکفوری

وەرگێڕانی: بکرحمە صدیق عارف

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خاتم الأنبياء والمرسلين محمد وعلى آله وصحبه أجمعين، أما بعد:

سیرەتی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم و پێشڕەویتی ئەو پێشەوا مەزنە (سڵاوی لەسەر بێت)، ئەگەر بە ووردی سەرنجی لێ بدەیین تەنها سەرچاوەیە: کە کانیاوەکانی ژیانی موسڵمانانی جیهانی ئیسلامی لێوە هەڵدەقوڵێت و ئاسودەیی کۆمەڵگای تێدایە.

مایەی خۆشحاڵی و دەستخۆشیە کە **پەیمانگای باسك بۆ پەروەردە و پێگەیاندن** لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ١٤٤٤ کۆچی لەسەر ئاستی هەرێمی کوردستان هەستا بەسازدانی پێشبرکێیەك بە ناونیشانی: **ژیانی شەفیعی ئوممەت**، بە شێوازی پرسیار و وەڵام لە پەرتوکی گوڵاوی سەرمۆر...

منیش بە خۆشحاڵیەوە هەستام بە ئامادەکردنی پرسیار و وەڵامەکان هەر لەسەرەتای ژیانی پێغەمبەری ئازیزمان صلى الله عليه وسلم تا ڕۆژی وەفاتی... بەو هیوایەی بەشداربووان سوودمەندبن لێی.

لە الله تەعالا دەپاڕێمەوە بە ڕەزامەندی خۆی هەموو کردەوەکانمان لێ وەرگرێت، بەڕاستی خوا گەورەترین پشتیوان و فریاد ڕەسە، درووود لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و ئال و بەیت و هاوەڵەکانی.

ڕۆژی شەممە ١٤٤٤/٤/٤کۆچی – ٢٠٢٢/١٠/٢٩زاینی

د. پشتیوان صابر عزیز

بەرپرسی پەیمانگای باسك بۆ پەروەردە و پێگەیاندن

هەرێمی کوردستان – هەولێر



**پ١/ سيرەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بريتی يە لە چی؟**

**و/** سيرەتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە ڕاستيدا بريتی يە: لەو پەيامەی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بۆ كۆمەڵگای مرۆڤايەتی هێنای و لەتاريكييەوە بەرەو ڕووناكی ڕزگاری كردن، لە كۆيلايەتی كردن بۆ مرۆڤ، ڕزگاری كردن بەرەو عەبدايەتی كردن بۆ خوا. ل٩

**پ٢/ عەرەبی موستەعرەبە كێن؟**

**و/** ئەو تيرانەن كە لەپشتی ئيسماعيل كوڕی ئيبراهيمە عليه السلام كەوتونەتەوە، بەعەرەبی عەدنانی ناسراون، عەرەبی عاريبەش – كە خێڵی قەحتانن – خەڵكی وڵاتی يەمەنن...ل١٠

**پ٣/ كێ يەكەم كەسبوو بانگەشەی خەڵكی مەككەی كرد بۆ بت پەرستی؟**

**و/** (عەمر)ی كوڕی (لحی) سەرۆكی (خزاعه) يەكەم كەس بوو بتێكی بەناوی (هبل) هێنا لە شامەوە و لە ناوەڕاستی كابەدا داينا، دوای ئەوە كەوتە بانگەشەكردنی خەڵكی مەككە بۆ بتپەرستی، ئەوانيش هاتن بەدەميەوە وشوێنی كەوتن...ل٣٣

**پ٤/ حاڵەتی عەرەب لە سەردەمی نەفاميدا لە رووی كۆمەڵايەتيەوە لە چ ئاستێكدا بوو؟**

**و/** بە كورتی، حاڵەتی كۆمەڵايەتی لە داكەوتنێكی ترسناكدا بوو، نەزانيی چوارلای تەنيبوون، مرۆڤەكان وەك ئاژەڵ مليان بۆ خورافات كەچ كردبوو، ژن دەفرۆشرا و دەكڕرا وەكو شمەك، پەيوەندی نێوان ئەندامانی كۆمەڵ بچڕابوو، هەموو خەمێكی حكومەتاكنيش ئەوەبوو گەنجينەكانيان پڕيكەن لە ماڵ و سامانی ڕەعيەت، يان جەنگ وهەرايان بنێنەوە.ل٤٦

**پ٥/ عەرەب لەسەردەمی جاهيليەتدا هەندێك ڕەوشتی بەرزيان تێدابوو، پێنج لەو ڕەوشتانە بژمێرە؟**

**و/** ١- بەخشندەيی ٢- وەفاداری و نەمەك شوناسی ٣- دەروون بەرزی ٤- سەرڕاستی و بەدەمەوەچوونی كار ٥- ئارامگرتن و لەسەرخۆيی و ئاغری.ل٤٧

**پ٦/ ناوی شەشی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بنوسە؟**

**و/** (محمد) صلی الله علیه وسلم کوڕی (عبدالله) کوڕی (عبدالمطلب) کوڕی (هاشم) کوڕی (عبد مناف) کوڕی (قصی).ل٥٠

**پ٧/ گرنگترین ڕووداوێك بەسەر (عبدالمطلب)دا هاتبێت لەبارەی (بیت)ە وە چی بوون؟**

**و/** ١- هەڵکەندنی بیری (زەمزەم). ٢- ڕووداوی (الفیل).ل٥٤

**پ٨/ (عبدالمطلب) کێی هەڵبژارد بۆ (عبدالله)ی کوڕی کەوا ببێتە هاوسەری؟**

**و/** (عبدالمطلب)، (ئامینەی)ی کچی (وەهەب)ی هەڵبژارد بۆ هاوسەرێتی (عبدالله)ی کوڕی، باوکی (ئامینە) سەرۆکی (بنی زهره) بوو خاوەنی بنەماڵەو ڕەچەڵەك و پلەوپایەوە بوو.ل٥٧.

**پ٩/ سەروەری پێغەمبەران صلی الله علیه وسلم لە کوێ و لە چ ڕۆژێك لەدایك بوو؟**

**و/** پێغەمبەری خۆشەویستمان صلی الله علیه وسلم لە شیوی (بنی هاشم)ی مەککە، سەرلەبەیانی دووشەممە (٩)ی ساڵی (فیل)ە کە لە داییك بوو، ئەو ڕۆژە بەرامبەرە لەگەڵ (٢٠) یان (٢٢)ی مانگی (چوار)ی ساڵی (٥٧١)یی زاییینی.ل٥٨

**پ١٠/ (عبدالمطلب) بەدوای زۆر دایەندا گەڕا بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم، ناوی ئەو دایەنە چی بوو کە دۆزیەوە و لە چ خێڵێك بوو؟**

**و/** ناوی دایەنەکە (حلیمە)ی کچی (أبو ذؤیب) بوو، وە لە خێڵی (بەنی سەعد) بوو.ل٥٩

**پ١١/ دایکی پێغەمبەری ئازیزمان صلی الله علیه وسلم لە کوێ وەفاتی کرد؟ وە تەمەنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم لەو کاتەدا چەند بوو؟**

**و/** دایکی پێغەمبەر صلی الله علیه ەسلم لە ( ئەبواء)ی نێوان مەککە و مەدینە کۆچی دوایی کرد، وەتەمەنی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم شەش ساڵان بوو.ل٦٢

**پ١٢/ پێغەمبەری ئازیزمان صلى الله علیه وسلم لە تەمەنی (١٥)ە ساڵیدا بەشداری جەنگێکی کرد، ناوی ئەو چەنگە چی بوو؟ وە بۆ ئەو ناوەی لێنرا؟**

**و/** ناوی جەنگەکە (فوججار)ە و ئەو ناوەی لێنرا لەبەر ئەوەی حورمەت و سنورەکانی تێدا شکاو لە مانگە حەرامەکاندا بوو.ل٦٤

**پ١٣ / پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم لە تەمەنی گەنجێتیدا کاروکەسابەتی کردووە، دووانیان بژمێرە؟**

**و/** ١- شوانی ٢- بازرگانی بە ماڵی خەدیجەوە (ڕەزای خوای لێ بێت).ل٦٦

**پ١٤/ تەمەنی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم و خەدیجە چەند بوون کاتێك هاوسەگیریان کرد؟**

**و/** تەمەنی پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم (٢٥) ساڵ بوو، وە تەمەنی (خەدیجە)ش (ڕەزای خوای لێ بێت) (٤٠) ساڵان بوو، وە یەکەم ژن بوو پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم خواستی و ژنی بەسەردا نەهێنا هەتا وەفاتی کرد.ل٦٦ و٦٧

**پ١٥/ ناوی ئەو ئەشکەوتە چیە کە پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم گۆشەگیری تێدا دەکرد و جبریل علیه السلام چەند ئایەتێکی لە قورئانی پیرۆز بۆ هێنایە خوارەوە؟**

**و/** ئەشکەوتی (حیڕاء).ل٧٢

**پ١٦/ یکەم ئایەت دابەزیە سەر پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم لە ئەشکەوتی (حیڕاء) چی بوو؟**

**و/** ئەم ئایەتانە بوون: اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ١ خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ ٢ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ٣...ل٧٤

**پ١٧/ ئەو ئایەتانە بنوسە کە بۆ یەکەم جار دابەزینە سەر پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم باسی فەرمانی بانگەوازکردن دەکات بۆ لای خوای پەروەردگار؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم لەچەند ئایەتێکدا چەند فەرمانێکی پێگەیشت لەوانە: يَا أَيُّهَا الْمُدَّثِّرُ (١) قُمْ فَأَنْذِرْ (٢) وَرَبَّكَ

فَكَبِّرْ (٣) وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ (٤) وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ (٥) وَلَا تَمْنُنْ تَسْتَكْثِرُ (٦) وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ (٧).ل٨٠

**پ١٨/ ڕۆڵ و قۆناغەکانی بانگەوازی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند بوون؟**

**و/** دەکرێت سەردەمی بانگەوازە موحەممەدیەکە بکەین بە دوو ڕۆڵی سەرەکی کە هەر یەکێکیان بە تەواوی لەوی تریان جیایە، ئەوانیش:

١-ڕۆڵی مەککەیی، کە نزیکەی سیانزە ساڵە.

٢-ڕۆڵی مەدینەیی، دە ساڵی تەواوە.ل٨٣

**پ١٩/ کێ بوون ئەوانەی لە یەکەم ڕۆژەکانی بانگەوازدا باوەڕیان هێناو موسڵمان بوون؟**

**و/** لە پێشەنگی هەموویانەوە هاوسەری پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم خەدیجەی دایکی ئیمانداران خوا لێی ڕازی بێت و غولامەکەی (زەید)ی کوڕی (حارثە) و (عەلی کوڕی ئەبوتاڵیبی) ئامۆزای و هەروەها (ئەبوبەکری سدیق)ی دۆستی و خۆشەویستی.ل٨٥

**پ٢٠/ ئایە لە سەرتای بانگەوازدا نوێژ فەرمانی پێ کرابوو؟**

**و/** (مقاتل)ی کوڕی (سلیمان) دەڵێت: لەسەرەتای ئیسلامدا خوای گەورە دوورکات نوێژی بەیانی و دوورکات نوێژی خەوتنانی فەرزکرد، بە بەڵگەی ئایەتی: {وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ بِالْعَشِيِّ وَالْإِبْكَارِ} (٥٥)غافر.ل٨٧

**پ٢١/ (أبو لهب) لە وەرزی حەجدا چۆن دژایەتی پێغەمبەری خوای دەکرد؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو وەرزەدا بانگەوازی خەڵکی دەکرد بۆ لای خوا، (أبو لهب)یش بەدوایەوە بوو، دەیوت: خەڵکینە بەگوێی مەکەن ئەو پیاوە هەڵگەڕاوەیەکی درۆزنە.ل٩٦

**پ٢٢/ قورەيشيەكان چەند شێوازێكيان هەڵبژارد بۆ رووبەڕووبونەوەی بانگەوازی پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم، ئەو شێوازانە چی بوون؟**

**و/** ١- گاڵتە پێكردن و سوكايەتی كردن. ٢- شێواندنی فەرمايشتەكانی و وروژاندنی گومان. ٣- دژايەتی كردنی قورئان و وێناكردنی بە ئەفسانەی پێشينان. ٤- هەوڵدان بۆ گەيشتنی ئيسلام و جاهيليەت لەنيوەی ڕێگادا.ل٩٧-٩٩

**پ٢٣/ موشريكەكان چۆن ئەشكەنجەی (خباب)ی كوڕی (ئەرت)يان دەدا؟**

**و/** بە چەندين جۆر ئەشكەنجەيان دەدا، قژی سەريان دەگرت و ڕايان دەكێشا، مليان بادەدا بەتوندی و چەند جارێك لەسەر سكڵی گەشكراو دايان دەنا، پاشان بەردێكيان لەسەر سنگی دانا، بۆ ئەوەی نەتوانێت هەستێتەوە.ل١٠٦

**پ٢٤/ بۆچی پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم ماڵی (ارقم) كوڕی (أبی أرقم)ی مەخزومی هەڵبژارد بۆ كۆبوونەوەی لەگەڵ موسڵمانەكاندا؟**

**و/** پيغەمبەر خوا صلی الله عليه وسلم لە ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرێتيەوە ماڵەكەی (ارقم)ی كردبووە مەڵبەندێك بۆ بانگەوازەكەی، لەبەر ئەوەی خانوەكەی (ارقم) لەسەر گردی (سەفا) بوو، لەبەر چاوی زاڵمان و ديوەخانەكانيان دووربوو.ل١٠٨

**پ٢٥/ يەكەم كۆچ بەرەو كوێ بوو؟ وە لەبەرچی بوو؟ وە چەند كەس بوون كە كۆچيان كرد؟**

**و/** كۆچی يەكەم لە ڕەجەبی ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرايەتيدا بەرەو حەبەشە بوو، لەبەر ئەوەی ئەزيدانی موسڵمانان لەو ساڵە توند و تيژتر بوو، هەتا جێگەيان لە مەككەدا پێ لەق بو، بۆيە بە فەرمانی پێغەمبەری خوا صلی الله عليه وسلم يەكەم پۆلی هاوەڵانی نارد بۆ حەبەشە، كە پێكهاتبوو لە (١٢) پياو وژن، سەرۆكەكەيان (عثمان)ی كوڕی (عفان) بوو، خاتوو (رقيە)ی كچی پێغەمبەر صلی الله عليه وسلم وهاوسەری لەگەڵدا بوو.ل ١٠٩-١١٠

**پ٢٦/ موسڵمان بوونی (حمزە) خوا لێی ڕازی بێت کەی بوو؟ وە هۆکارەکەشی چی بوو؟**

**و/** موسڵمان بوونی (حمزە) خوا لێی ڕازی بێت لە کۆتاییەکانی ساڵی شەشەمی پێغەمبەرێتیدا بوو، وە هۆی موسڵمانبوونیشی بریتی بوو لە تووڕە بوونی لەبەر سوکایەتی کردنی (ابوجهل) بە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و ئازاردانی.ل١١٩

**پ٢٧/ ناوەڕۆکی ئەو پەیماننامەی قوریشیەکان کە دژ بە (بنی هاشم) و (بنی عبدالمطلب) چی بوو؟**

**و/** هەموو قوریش لە (ضیف)ی (بنی کنانە) لە شیوی (المحصب) کۆبونەوە وپەیماننامەیەکیان نووسی چەند بەڵێن و پەیمانێکی تێدا بوو کە (هەرگیز هیچ جۆرە سوڵحێکیان لەگەڵدا نەکرێت وبەزەییان پیایاندا نەیەتەوە، هەتا پێغەمبەریان تەسلیم دەکەن بۆ کوشتنی).ل١٢٨

**پ٢٨/ ساڵی ماتەمینی بۆ ئەو ناوەی لێنراوە؟**

**و/** لەبەر ئەوەی لەو ساڵەدا (أبو طالب) مامی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم و (خدیجە)ی دایکی ئیمانداران ڕەزای خوای لی بێت کە گەورەژنی پێغەمبەری خوا بوو صلی الله علیه وسلم وەفاتیان کرد.ل١٣٤-١٣٥

**پ٢٩/ هۆیەکانی دان بەخۆدا گرتن و دڵ قایم بوون چین؟**

**و/** ١- باوەڕبوون بە خوای تاك وتەنها وبەڕاستی ناسینی. ٢- سەرکردایەتیەك دڵان کەمەند کێشی خۆی دەکات. ٣- هەست کردن بەبەرپرسیارێتی. ٤- باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی. ٥- بەڵگەکانی قورئانی پیرۆز لەسەر ڕاستیەکانی ئیسلام. ٦- مژدەدان بە سەرکەوتن.١٣٧-١٤٢

**پ٣٠/ لە وەرزی حەجی ساڵی (١١)ی پێغەمبەرێتیدا، لە (عقبە)ی (منی)دا پێغەمبەری ئازیزمان صلی الله علیه وسلم لەگەڵ چەند کەسێك قسەی کرد دەربارەی ئیسلام، ژمارەی ئەو کەسانە چەند بوون و خەڵی کوێ بوون؟**

**و/** ژمارەی ئەو کەسانە شەش گەنجی (یثرب)یی بوون، هەموویان لە (خەزرەج) بوون، وە کاتێك گەڕانەوە بۆ (یثرب) پەیامی ئیسلامیان بۆ بردن.ل١٥٨-١٥٩

**پ٣١/ (ابن القیم) ڕەحمەتی خوای لێ بێت دەربارەی شەوڕەوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی دەڵێت؟**

**و/** (ابن القیم) دەڵێت: ڕاست وەهایە کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەجەستەی شەوڕەوی پێکراوە، لە مزگەوتی حەرامەوە بۆ (بیت المقدس)، بەسواری بوراق و بە هاوڕێیەتی (جبریل) علیه السلام.ل١٦١

**پ٣٢/ لە (دار الندوە) قوریشیەکان ترسناکترین کۆبوونەوەیان ئەنجامدا وبریارێکیان دا، خاوەنی پێشنیاری ئەو بریارە کێ بوو و بریارەکە چی بوو ؟**

**و/** خاوەنی پێشنیاری بریارەکە (ابوجهل) بوو، وە پێشنیاری کرد کەوا لەهەر تیرەیەك گەنجێکی ئازا دیاری بکەن و شمشێرێکی بڕندەی بدەنە دەست و بڕۆنە سەر پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەیەکەوە بیدەنە بەر شمشێر و بیکوژن.ل١٨٤

**پ٣٣/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەی هیجرەتی کرد؟ لە ڕێگا لە ئەشکەوتێك مانەوە، ئەو ئەشکەوتە ناوی چی بوو؟ وە چەند شەو لەوێ مانەوە؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەشەوی (٢٧)ی مانگی (صفر)ی ساڵی (١٤)ی پێغەمبەرێتی ماڵەکەی بەجێهێشت و چوو بۆ ماڵی هاوەڵەکەی (ابوبکر) لەوێشەوە بەپەلە لە مەککە دەرچوون پێش ئەوەی بەرەبەیان هەڵبێت... وە لە ئەشکەوتی (ثور) مانەوە بۆ ماوەی (سێ) شەو، شەوی هەینی و شەوی شەممە و شەوی یەك شەممە.ل١٨٨

**پ٣٤/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەی گەشتە (قباء)؟ وە یەکەم ئیش چی بوو لەوێ ئەنجامیدا؟ وە نوێژی جومعەی لە کوێ کرد؟**

**و/** لە ڕۆژی دووشەممەی (٨)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١٤) پێغەمبەرێتی، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە (قباء) دابەزی، وە چوار ڕۆژ مایەوە لەوێ، وە مزگەوتی (قباء)ی دروست کردو نوێژی تێداکرد، وە لە ڕۆژی هەینی بەرەو شاری مەدینە کەوتەڕێ، لە خێڵی (بنی سالم) کاتی جومعە هات و نوێژی جومعەیان کرد.ل١٩٦-١٩٧

**پ٣٥/ ئەو خەڵکانەی کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە مەدینەدا ڕووبەڕوویان دەبوەوە سێ جۆر بوون، ئەو جۆرانە کێ بوون؟**

**و/** ١- مرۆڤە پوختە بەڕێزەکانی هاوەڵی (خوا لێیان ڕازی بێت). ٢- ئەو موشریکانەی کە هێشتا باوەڕیان نەهێنا بوو، ئەمانە تیرە و هۆزەکانی مەدینە بوون. ٣- جولەکە.ل٢٠٢

**پ٣٦/ لەناو (یثرب)دا سێ هۆزی جولەکەی بەناوبانگی تێدا بوو، کێ بوون؟**

**و/** ١- (بنو قینقاع): کە هاوپەیمانی (خەزرەج) بوون. ٢- (بنو النضیر) ٣- (بنو قریظة) ئەم دوو هۆزەی دوایین هاوپەیمانی (أوس) بوون.ل٢٠٦

**پ٣٧/ یەکەم هەنگاوی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە شاری مەدینە چی بوو؟**

**و/** یەکەم هەنگاو بریتی بوو لە دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لەو جیگایەی کە وشترەکەی چۆکی دادا، زەویەکەی لە دوو کوڕی بێ باوك کڕی، خۆشی بەشداری کرد لە بنیاتنانەکەدا.ل٢١٠

**پ٣٨/ سێ بەند لە بەندەكانی بەڵگەنامەی هاوپەیمانێتی ئیسلامی لە شاری مەدینە بنوسە؟**

**و/** ١- هەموویان یەك ئوممەتن. ٢- نابێت ئیمانداریك ئیمانداریكی تر بكوژێت لەبەر كافرێك. ٣- نابێت ئیماندار پشتیوانی كافرێك بكات دژ بە موسڵمانێك.ل٢١٣

**پ٣٩/ ئەو ئایەتە كامەیە كە خوای گەورە مۆڵەتی شەڕكردنیدا بە موسڵمانەكان؟**

**و/** خوای گەورە دەفەرموێت: {أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَاتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا ۚ وَإِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ (٣٩)}الحج.ل٢٢٢

**پ٤٠/ سریەی (سيف البحر) كەی بوو وكێ سەرۆكی بوو؟**

**و/** لە ڕەمەزانی ساڵی (١)ی كۆچییدا بوو – بەرامبەر بە مارتی ساڵی (٦٢٣)ز – پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم حەمزەی مامی كردە سەرۆكی ئەم سریەیە، بۆ ڕێگرتن لە كاروانێكی قوڕیش كە لە شامەوە دەهاتەوە.ل٢٢٤

**پ٤١/ لە جەنگی بەدردا ئاڵا گشتیەكە كە ڕەنگی سپی بوو درا بە دەستی كێ؟**

**و/** درایە دەستی (مصعب)ی كوڕی (عمیر).ل٢٣٣

**پ٤٢/ لە جەنگی بەدردا ژمارەی سوپای ئیسلام چەند بوون؟ وە ژمارەی سوپای موشریكەكان چەند بوون؟**

**و/** ژمارەی سوپای ئیسلام (٣١٤ تا ٣١٧) كەس بوون، وە ژمارەی سوپای موشریكەكان (١٣٠٠) كەس بوون.ل٢٣٤

**پ٤٣/ یەكەم سووتەمەنی جەنگی بەدر كێ بوو؟ وە بەدەستی كێ كوژرا؟**

**و/** یەكەم قوربانی جەنگەكە (اسود)ی كوڕی (عبدالاسد المخزومی) كابرایەكی دڕەندی بێ ڕەوشت بوو، وە بەدەستی (حمزە)ی كوڕی (عبدالمطلب) كوژرا.ل٢٤٦

**پ٤٤/ كێ بوون ئەوانەی (أبو جهل)یان كوشت؟**

**و/** دوو كوڕی منالْكار بەناوی (معاذ)ی كوڕی (عمرو) كوڕی (جموح) و (معوذ) كوڕی (عفراء) لە جەنگی بەدردا هەڵیان كوتایە سەر (أبو جهل) و دایانە بەر شمشێر وكوشتیان.ل ٢٥٢

**پ٤٥/ كۆتایی جەنگی بەدر دەرئەنجامەكەی چۆن بوو؟**

**و/** شەڕەكە بە شكاندنێكی خراپی موشریكان و سەركەوتنێكی گەورەی موسڵمانان كۆتایی هات، لە موسڵمانەكان (١٤) كەس شەهید بوون، وە لە موشریكەكانیش (٧٠)یان لێ كوژرا و (٧٠) یان لێ بەدیل گیرا.ل٢٥٧

**پ٤٦/ لە غەزای ئوحود ژمارەی سوپای موسڵمانان و موشریكەكان چەند بوون؟**

**و/** ژمارەی سوپای موسڵمانان لە (١٠٠٠) چەكدار پێكهاتبوو، وە ژمارەی سوپای موشریكەكان (٣٠٠٠) جەنگاوەر بوون.ل٢٨٥

**پ٤٧/ لە جەنگی ئوحود سوپای موشریكەكان لە گەڵ خۆیاندا ژنانیان هێنا بوو، هۆكارەكەی چی بوو، وە ژمارەیان چەند بوون؟**

**و/** بۆ ئەوەی كاریگەری زیاتر بێت بۆ ڕاكێشانی پیاوان و بەرگری كردن لە حورمەت و شەرەفیان، وە ژمارەیان (١٥) ژن بوون.ل٢٨٥

**پ٤٨/ لە جەنگی ئوحودا پێش ئەوەی دەست پێ بكات لە سوپای موسڵمانان یاخی بوون دروست بوو، ئەو یاخی بوونە بەسەرپەرشتی كێ بوو؟ وە ژمارەیان چەندبوون؟**

**و/** یاخی بوونەكە بەسەرپەرشتی (عبدالله)ی كوڕی (أبی)ی كوڕی (سلول) ی دووڕوو بوو، وە ژمارەیان (٣٠٠) جەنگاوەر بوون.ل٢٩٠

**پ٤٩/ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لە غەزوەی ئوحوددا مەفرەزەیەكی تیرهاوێژی دیاری كرد و فەرمانی پێدان لەسەر گردێك كۆببنەوە، ژمارەی ئەو مەفرەزە چەند بوو؟ وە بەرپرسەكەیان كێ بوو؟**

**و/** ژمارەیان (٥٠) كەس بوون، وە (عبدالله)ی كوڕی (جبير)ی كوڕی (النعمان)ی ئەوسی بەدری بەرپرسی ئەو مەفرەزەیە بوو.ل٢٩٢

**پ٥٠/ یەكەم سووتەمەنی جەنگی ئوحود كێ بوو؟ وە بەدەستی كێ كوژرا؟**

**و/** یەكەم سووتەمەنی شەڕەكە ئاڵا هەڵگری موشریكان (طلحە)ی كوڕی (أبی طلحە العبدری) بوو، وە بەدەستی (زبير)ی كوڕی (عوام) كوژرا.ل٢٩٦

**پ٥١/ شێری خودا (حمزە)ی كوڕی (عبدالمطلب)ی مامی پێغەمبەری خودا صلى الله عليه وسلم بەدەستی كێ شەهید بوو لە جەنگی ئوحوددا؟**

**و/** (حەمزە) بەدەستی (وەحشی)ی كوڕی (حرب) شەهید كرا.ل٢٩٩

**پ٥٢/ ئەو كەسە كێ بوو كە هێشتا تازە زاوا بوو، كە گوێی لە دەنگی جەنگ بوو، دەستبەجێ ژنەكەی بەجێ هێڵاو چوو بۆ جیهاد وشەهید بوو؟**

**و/** ئەو كەسە (حنظلە)ی شۆراوبوو – ناوی (حنظلە )ی كوڕی (ابی عامر) بوو ویستی سەركردەی موشریكان (أبو سفيان) بكوژێت، بەڵام (شداد)ی كوڕی (اسود) شمشێرێكی لێداو شەهیدی كرد.ل٣٠٠

**پ٥٣/ هەڵە گەورەكەی تیرهاوێژان لە جەنگی ئەحوددا چی بوو؟**

**و/** سوپای ئیسلام خەریك بوو سەركەوتن بەدەست بێنن، كاتێك تیرهاوێژەكان بینیان موسڵمانەكان دەسكەوتەكانی جەنگی بێ باوەڕان كۆدەكەنەوە لەلایەن زۆرینەیان كە ژمارەی (٤٠) كەس بوون كێوەكەیان بەجێ هێشت و هاتنە خوارەوە، بەمەش فەرمانی

پێغەمبەری خوایان صلی الله علیه وسلم شکاند، بۆیە بووە هۆی گەیاندنی زیانێکی گەورە بە موسڵمانەکان.ل٣٠٢

**پ٥٤/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم لە جەنگی ئوحوددا بە کێی ووت: خوا لەت و پەتت بکات؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە (عبدالله)ی کوڕی (قمئة) ووت، لەو کاتەی شمشێرەکەی لەسەر ڕوومەتی پیرۆزی توند بوو و ووتی: دە بخو ئەوە منم (ابن قمئة)، پێغەمبەری خواش صلی الله علیه وسلم لە کاتێکدا کە خوێنی نێوچاوانی دەسڕی فەرمووی: خوا لەت وپەتت بکات.ل٣٠٧

**پ٥٥/ کێ (ئوبەی) کوڕی (خەلەف)ی موشریکی لە جەنگی ئوحوددا کوشت؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بە رمەکەی (حارث)ی کوڕی (ضمة) لێیداو لەسەر ئەسپەکەی هەڵیدایە خوارەوە لە خۆڵەکەدا گەوزاندی وبریندااری کرد و لەکاتی گەڕانەوەدا بەرەو مەککە لە (سرف) مرد.ل٣١٥

**پ٥٦/ ژمارەی کوژراوەکانی سوپای ئیسلام و سوپای موشریکان لە جەنگی ئوحوددا چەند بوون؟**

**و/** زۆرینەی سەرچاوەکان لەسەر ئەوە ڕێکن کە کوژراوی موسڵمانەکان (٧٠) کەس بووە و زۆربەیان لە ئەنسارەکان بوون، وە ژمارەی کوژراوەکانی موشریکان (٣٧) کەس بوون.ل٣٢٦

**پ٥٧/ لە کارەساتی بیری (معونە) چەند هاوەڵ شەهید بوون وهۆکارەکەش چی بوو؟**

**و/** لەو کارەساتە (٧٠) هاوەڵ شەهید بوون، بە هۆی ناپیاویی وپەیمانشکێنی (عامر)ی کوڕی (طفیل) کە داوای کرد لە خێڵی (بنی سلیم) لەو خێڵە تیرەی (عصبە) و (رعل) و (ذکوان) چوون بە هانایەوەو تا گەمارۆی هاوەڵەکانی پێغەمبەری خوایاندا صلی الله علیه وسلم دەستیان کرد بە شەڕ تا دواکەسیان شەهید کران.ل٣٣٨

**پ٥٨/ هۆکاری غەزای (بنی النضیر) چی بوو؟**

**و/** (بنی النضیر) خیانەتیان کرد وهەستان بە پیلانێك بۆ شەهیدکردنی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بەڵام سەری

نەگرت چونکە (جبريل) عليه السلام لەلایەن پەروەردگاریەوە دابەزی بۆ سەر پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وهەواڵی پیلانەکەی پێ فەرموو.ل٣٤٠

**پ٥٩/ خاوەن بیرۆکەی هەڵکەندنی (خندق) لە جەنگی (ئەحزاب) کێ بوو؟**

**و/** سەلمانی فارسی – خوا لێ ڕازی بێت – خاوەنی ئەو بیرۆکەیە بوو، وتی: پێغەمبەری خوا، ئێمە لە وڵاتی فارسدا کە گەمارۆ بدراینایە بە چواردەوری خۆماندا خەندقەمان لێدەدا.ل٣٤٩

**پ٦٠/ لە غەزوەی (بنى قريظة) پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم داوای لە هاوەڵێ کرد فەرمان بدات بەسەریاندا، ئەو هاوەڵە کێ بوو؟ وە فەرمانەکەشی چی بوو؟**

**و/** ئەو هاوەڵە (سعد)ی کوڕی (معاذ) بوو، ووتی: من فەرمان دەدەم بەکوشتنی پیاوەکانیان و ئەسیر کردنی ژن و منداڵەکانیان ودابەش کردنی ماڵ و سامانەکانیان.ل٣٦٥

**پ٦١/ کێ بوو (سلام)ی کوڕی (ابى الحقيق)ی جولەکەی کوشت؟**

**و/** (عبدالله)ی کوڕی (عتيك) لە تیرەی (بنى سلمه)ی (خەزرەجی) کوشتی.ل٣٦٩

**پ٦٢/ غەزای (بنو المصطلق) یان غەزای (مريسيع) کەی بوو؟ وە لەو غەزایە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه کێی خواست؟**

**و/** ئەو غەزایە لە شەعبانی ساڵی (٦)ی کۆچیدا بوو، وە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم (جويريه)ی کچی (الحارث) لە پاش ئازادکردنی مارەی کرد وخواستی.ل٣٧٧

**پ٦٣/ ڕووداوی حودەیبیە کەی ڕوویدا؟**

**و/** لە مانگی (ذى القعده)ی ساڵی (٦)ی کۆچی ڕوویدا.ل٣٩٠

**پ٦٤/ وەستانی جەنگ لە نێوان موسڵمانان و موشريكان لە پەيماننامەی حودەيبيە بۆ چەند ساڵ بوو؟ وە سەرۆكی شاندی قوەڕەيش كێ بوو؟**

**و/** بۆ ماوەی (١٠) ساڵ بوو، وە (سهيل)ی كوڕێ (عمرو) سەرۆكی شاندی موشريكان بوو.ل٣٩٦

**پ٦٥/ مۆرەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن بوو؟**

**و/** مۆرەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بريتی بوو لە موستيلەيك ونەخشەی لەسەر هەڵكەند بە نوسينی: محمد رسول الله، نەخشەكەش سێ دێر بوو، (محمد) يەك دێر، (رسول) يەك دێر، (الله) يەك دێر، بەم شێوەيە: (محمد رسول الله).ل٤٠٧

**پ٦٦/ ناوی (نجاشی) چی بوو؟ وە گەورەی كوێ بوو؟**

**و/** نەجاشی ناوی (اصحمه)ی كوڕی (أبجر) بوو، وە گەورەی حەبەشە بوو.ل٤٠٧

**پ٦٧/ ناوی (مقوقس) چی بوو؟ وە پادشای كوێ بوو؟**

**و/** ناوی (جريج)ی كوڕی (متى) بوو، وە پادشای ميسرو ئەسكەندەريە بوو.ل٤١٠

**پ٦٨/ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم كێی ڕاسپارد بۆ گەياندنی نامەكەی بۆ قەيسەری پادشای ڕۆمەكان؟**

**و/** بۆ گەياندنی ئەم نامەيە (دحيه)ی كوڕی (خليفه)ی (كەلبی) هەڵبژارد، فەرمانی پێدا كە بيداتە گەورەی (بصری) تا ئەويش بيداتە دەست (هرقل) گەورەی ڕۆمەكان.ل٤١٤

**پ٦٩/ يەكەم غەزا لە پاش يەيمانی حودەيبيە چی بوو؟**

**و/** يەكەم غەزا كە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئەنجامی دا غەزای (غابه) يان غەزای (ذی القرد) بوو، وە بريتی بوو لە ڕاونانی پۆلێك لە خێڵی (فزاره) كە خەريكی چەتەگەرێتی بوون لە سەره ڕێگەی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم.ل٤٢٣

**پ٧٠/ هۆی غەزای (خەیبەر) چی بوو؟**

**و/** لەبەر ئەوەی جولەکەی خەیبەر هەموو ئەحزابیان کۆ کردەوە بۆ دژایەتی کردنی موسڵمانەکان و هانی (بنو قریظە)شیاندا بۆ خیانەت کردن وپەیمانشکێنی، وە بوبوە مەڵبەندی شەڕ فرۆشی سەربازی وئاشوبگێڕی... وە بۆ ئەوەی هێمنایەتی و ئاشتی بەتەواوەتی بەرقەرار بێت لە ناوچەکەدا، بۆیە بریاری ئەو غەزایە درا.ل٤٢٥

**پ٧١/ گەڕانەوەی (جعفر)ی کوڕی (أبی طالب) و ئەشعەریەکان لە حەبەشەوە بۆ مەدینە کەی بوو؟**

**و/** لەکاتی فەتحی خەیبەر بوو، کە جەعفەر گەیشت بە خزمەت پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم پێشوازی لێ کرد و ماچی کرد و فەرمووی: وەڵلاهی نازانم بەکامیان دڵم خۆش بێت؟ بە هاتنەوەی (جعفر) یان فەتح کردنی (خیبر).ل٤٣٨

**پ٧٢/ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەی (صفیە)ی کچی (حیی) مارە کرد؟**

**و/** لە پاش فەتحی خەیبەر، (کنانە)ی کوڕی (أبی الحقیق)ی هاوسەری (صفیە) بە هۆی پەیمانشکێنیەوە کوژرا، وە (صفیە) بە کۆیلەیی هێنرا بۆ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و پێغەمبەریش بانگی کرد بۆ ئیسلام، لەوێدا (صفیە) موسڵمان بوو، پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم ئازادی کرد ومارەی کرد.ل٤٣٩

**پ٧٣/ کوژراوانی هەردوولا لە شەڕەکانی خەیبەردا چەند بوون؟**

**و/** کۆی شەهیدانی موسڵمانان لە شەڕەکانی خەیبەردا (١٦) پیاو بوو، وە ژمارەی کوژراوەکانی جولەکەش (٩٣) کەس بوە.ل٤٤٠

**پ٧٤/ پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم چۆن مامەڵەی کرد لەگەڵ جولەکەی (تەیماء)؟**

**و/** جولەکەی (تەیماء) هیچ بەرنگاریەکی موسڵمانەکانیان نەکرد و نوێنەری خۆیان نارد بۆلای پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم بۆ سوڵح کردن، وە پێغەمبەریش صلى الله عليه وسلم ئەوەی لێ قەبوڵ کردن و لەسەر ماڵ و حاڵی خۆیان مانەوە.ل٤٤٢

**پ٧٥/ غەزای (ذات الرقاع) کەی بوو؟ وە هۆکارەکەشی چی بوو؟**

**و/** ئەم غەزایە لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی (٧)ی کۆچی دا رووی داوە، وە هۆکارەکەشی تەمێ کردنی عەرەبە دەشتەکیانە بوو کە بەردەوام خەریکی ڕاوەدونان و چەتەگەریی و تاڵانکاریی بوون.ل٤٤٤

**پ٧٦/ جەنگی (مؤتە) کەی روویدا؟ وە هۆکارەکەی چی بوو؟**

**و/** ئەم جەنگە لە (جمادی یەکەم)ی ساڵی (٨)ی کۆچیدا ڕووی داوە، وە هۆی جەنگەکە ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم بە (حارث)ی کوڕی (عمیر)ی (ازدی)دا نامەیەکی نارد بۆ گەورەی (بصری)، لە ڕێگەدا (شرحبیل) کوڕی (عمرو)ی (غسان)ی کە سەرکار بوو بەسەر خاکی (بلقاء)ی شامەوە لەلایەن (قیصر)ەوە دانرابوو، ئەم پیاوە چووە ڕێگەی نێرراوەکەی پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم، گرتی و بەستیەوە وکوشتی.ل٤٥٢

**پ٧٧/ میرەکانی سوپای ئیسلام لە جەنگی (مؤتە) کێ بوون؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیە وسلم (زید)ی کوڕی (حارثە)ی کرد بە سەرکردەی سوپاو فەرمووی: ئەگەر شەهید بوو (جعفر) دابنێن، ئەگەر ئەویش شەهیدکرا (عبدالله)ی کوڕی (رواحە) دابنێن.ل٤٥٣

**پ٧٨/ ژمارەی سوپای ئیسلام و دوژمنان چەند بوون؟**

**و/** سوپای ئیسلام (٣) هەزار کەس بوون، وە سوپاکەی (هیرقل) (٢٠٠) هەزار چەکداربوون.ل٤٥٥

**پ٧٩/ لە پاش شەهیدبوونی هەرسێ ئەمیرەکەی جەنگی (مؤتە) ئاڵاکە درا بە کێ؟**

**و/** ئاڵاکە درا بە شمشێری خوا (خالید)ی کوڕی (وەلید).ل٤٥٦

**پ٨٠/ سریەی (ذات السلاسل) ژمارەیان چەند بوون و بە سەرکردایەتی کێ بوو؟**

**و/** ژمارەیان (٣٠٠) کەس بوون و بە سەرکردایەتی (عمرو)ی کوڕی (عاص) بوو.ل٤٥٩

**پ٨١/ غەزای فەتح كردنی مەككە كەی بوو؟ وە ژمارەی سوپاكە چەند بوو؟**

**و/** غەزاكە لە مانگی (ڕەمەزان)ی ساڵی (٨)ی كۆچیدا رویدا، وە ژمارەی سوپاكە (١٠) هەزار كەس بوون.ل٤٦٨

**پ٨٢/ هۆی غەزای فەتح كردنی مەككە چی بوو؟**

**و/** لەبەر ئەوەی قوڕەیشیەكان پەیمانیان شكاند، چونكە یارمەتی خێڵی (بنو بەكر)یاندا كە هاوپەیمانیان بوون، دژ بە خێڵی (خزاعە) كە هاوپەیمانی پێغەمبەری خوا بوون صلی الله علیه وسلم.ل٤٦١

**پ٨٣/ ئەو كەسە كێ بوو هەوڵی دا چوونی سوپای ئیسلام بەرەو مەككە ئاشكرا بكات بۆ قوریشیەكان؟**

**و/** ئەو كەسە (حاطب)ی كوڕی (أبی بلتعە) بوو، نامەیەكی نارد بۆ قوڕەیشیەكان، تێی گەیاندبوون كە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم بەرەو مەككە دێت، ئەم كارەیشی بۆ ئەوە كرد چونكە كەسوكارو مناڵەكانی لەناو مەككەدا بوون.ل٤٦٧

**پ٨٤/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چی بە خەڵگی مەككە ووت لەكاتی فەتحكردنیدا؟**

**و/** فەرمووی: خەڵكی قوڕەیش، ئێوە پێتان وایە من چیتان لێ دەكەم، وتیان: خێر و چاكە، برایەكی بەڕێز و برازایەكی بەڕێزیت. فەرمووی: من ئەوەتان پێدەڵێم كە یوسف علیه السلام بەبراكانی خۆی گوت:{ لَا تَثْرِيبَ عَلَيْكُمُ الْيَوْمَ } بڕۆن هەمووتان ئازاد بن.ل٤٧٦

**پ٨٥/ كێ بوو لەسەربانی كابەی پیرۆز بانگی دا؟**

**و/** كاتی نوێژ هات، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم فەرمانی دا بە (بیلال) كە بچێتە سەر كابەی پیرۆز بانگ بدات.ل٤٧٧

**پ٨٦/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسم چەند ڕۆژ لە مەككە مایەوە لە پاش فەتحكردنی؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ماوەی نۆزدە ڕۆژ لە مەككەدا مایەوە و دروشمەكانی ئیسلامی بۆ نوێ دەكردنەوە و ڕینموایی خەڵكی دەكرد بۆ هیدایەت و خواپەرستی.ل٤٨٢

**پ٨٧/ غەزای (حونەین) کەی بوو؟ وە هۆکەی چی بوو؟**

**و/** لە مانگی شەوالی ساڵی (٨)ی کۆچیدا روویدا، وە هۆکارەکەشی هەندێ خێڵی ملهوڕی (هوازن) و (ثقیف) بە لووت بەرزی خۆیاندا دەنازی و پییان شورەیی بوو ملکەچی بکەن، بۆیە چونە پاڵ (مالك)ی کوڕی (عوف)ی (نصری) و بڕیاریاندا بڕۆن بۆ شەڕی موسڵمانەکان.ل٤٨٧

**پ٨٨/ غەزای (تەبوك) کەی ڕوویدا؟ وە هۆکارەکەی چی بوو؟**

**و/** لە (ڕەجەب)ی ساڵی (٩)ی کۆچی دا ڕوویدا، وە هۆی غەزاکە ئەوە بوو کە (قیصر)ی رۆمەکان پێی وابوو دەبێ موسڵمانەکان سەرکوت بکرێن پێش ئەوەی گۆبەنگ و ئاشبویك دروست بکەن لە ناوچە عەرەبیە هاوسنورەکانی ڕۆمدا.ل٥٠٧

**پ٨٩/ بە کێ دەووترا خاوەن نهێنی ڕازگری نهێنییەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم؟**

**و/** حوزیفەی کوڕی یەمان – خوا لێی ڕازی بێت.ل٥١٦

**پ٩٠/ ئەبو بەکر- خوا لێی ڕازی بێت – کەی یەکەمین حەجی کرد؟**

**و/** لە مانگی (ذی القعدة) یان (ذی الحجة)ی ساڵی (٩)ی کۆچیدا، پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم (ئەبوبەکری صدیق)ی نارد وەك میرێك بۆ حەج، بۆ ئەوەی مناسك بۆ موسڵمانان دابنێت.ل٥٢٠

**پ٩١/ ئەو کەسە کێ بوو لە عەرەفەدا بەدەنگی وتەکانی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم، بۆ خەڵکەکە دەوتەوە؟**

**و/** رەبیعەی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەڵەف بوو.ل٥٤٥

**پ٩٢/ دوایین سوپای ئیسلام کە پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم ڕێکیخست لە مانگی چەند بوو؟ وە کێی دیاری کرد بۆ سەرکردایەتی کردنی؟**

**و/** لە مانگی (صفر)ی ساڵی (١١)ی کۆچیدا بوو، وە (ئوسامە)ی کوڕی (زید)ی کردە سەرکردەی سوپاکە.٥٤٩

**پ٩٣/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم چەند ڕۆژ نەخۆش کەوت؟ وە بە نەخۆشیەکەی چەند نوێژی کرد بۆ موسڵمانان؟**

**و/** هەموو ڕۆژەکانی نەخۆشیەکەی (١٣) یان (١٤) ڕۆژ بوو، وە بەنەخۆشیەکەی (١١) ڕۆژ نوێژی کرد بۆ موسڵمانان.ل٥٥١

**پ٩٤/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوا هەفتەی ژیانی لە لای چی خێزانێکی مایەوە؟**

**و/** پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم دوایین هەفتەی لە ماڵەکەی عائیشە - خوا لێی ڕازی بێت – بەسەر برد.ل٥٥١

**پ٩٥/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش چوار ڕۆژ پێش وەفاتی سێ وەسیەتی کرد، ئەو وەسێتانە چی بوون؟**

**و/** لەو ڕۆژەدا وەسیەتی بە سێ شت کرد: ١- وەسیەتی کرد جولەکە و نەسرانی وموشریکان لە دورگەی عەرەبدا بکرێنە دەرەوە. ٢- وەسیەتیشی کرد بە مۆڵەتدانی سەردانی وەفدەکان هەروەکو خۆی مۆڵەتی دابوو. ٣- راوی فەرموودەکە لەبیری چوو، لەوانەیە وەسیەت بێت دەست گرتن بە قورئان و سوننەتەوە، یان بەڕێکردنی سوپاکەی ئوسامە، یان وتی نوێژ و پاراستنی مافی موڵکی یەمین.ل٥٥٣

**پ٩٦/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم پێش ڕۆژێك پێش وەفاتی چی کرد؟**

**و/** ڕۆژێك پێش وەفاتی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم – ڕۆژی یەك شەممە - غولامەکانی ئازاد کرد، حەوت دیناری هەبوو هەمووی کرد بەخێر، چەکەکانیشی کرد بە سەدەقە بۆ موسڵمانان...ل٥٥٤

**پ٩٧/ پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم کەی وەفاتی کرد؟**

**و/** لە ژوورەکەی عائیشە - خوا لێی ڕازی بێت - لە چێشتەنگاوی ڕۆژی دووشەممە (١٢)ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (١١)ی کۆچی، لە تەمەنی (٦٣) ساڵو چوار ڕۆژ وەفاتی کرد.ل٥٥٧

**پ٩٨/ هەڵوێستی (عمر)ی کوڕی (خطاب) – ڕەزای خوای لێ بێت - چی بوو کاتێك هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری بیست صلى الله عليه وسلم؟**

**و/** کە عومەر هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری خوای بیست سەرگەردان بوو، هۆشی لای خۆی نەما، هاواری دەکرد: دووڕووەکان دەڵێن پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم مردووە، پێغەمبەری خوا نەمردووە بەڵکو چووە بۆلای پەروەردگاری خۆی....وەڵلاهی دەگەڕێتەوە، ئەوجا دەست و قاچی ئەوانە دەبڕێت کە وتویانە مردووە.ل٥٥٧

**پ٩٩/ هەڵوێستی (أبو بكر)ی (صديق) – ڕەزای خوای لێ بێت - چی بوو کاتێك هەواڵی وەفاتی پێغەمبەری بیست؟**

**و/** ئەبو بەکر – خوا لێی ڕازی بێت – چووە ژوورەکەی عائیشە و پەردەی سەری پیرۆزی پێغەمبەری هەڵدایەوە، خۆیدا بەسەریدا و ماچی کرد دەستی کرد بە گریان...پاشان دەرچووە دەرەوە بەخەڵکەکەی فەرموو: هەر کەسێك لە ئێوە موحەممەدی دەپرست صلى الله عليه وسلم ئەوە موحەمەد صلى الله عليه وسلم وەفاتی کرد، هەرکەسێکیش لە ئێوە خودای پەرستووە، ئەوە خوا زیندووە و هەرگیز نامرێت.ل٥٥٨

**پ١٠٠/ شۆردن و کفن کردنی پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم کەی بوو؟ وە جەسدەی پیرۆزی لە کوێ ئەسپەردە کرا؟**

**و/** لە ڕۆژی سێ شەممە پێغەمبەریان شۆرد صلى الله عليه وسلم بێ ئەوەی جلەکانی لەبەر داکەنن، پاشان کفن پۆشیان کرد لە سێ بەرگی سپی خامدا... وە سەبارەت بە شوێنی ئەسپەردە کردنەکەشی لەو شوێنە بوو کە وەفاتی تێدا کرد کە ژوورەکەی عائیشە بوو – ڕەزای خوای لێ بێت.ل٥٥٩

**وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام**

**على أشرف المرسلين سيدنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين**

